# ڕەهەندەکان و جیاوازییەکانیان

## 3D - 4D - 5D



بەئاگاهاتنی ڕۆحـــی

نووسین: هەڵۆ ئارام

ئامادەکردن: ئاڵدن ڤاڵ

# پێشەکی

کاتێک بە پرۆسەی بە ئاگاهاتنی رۆحیدا دەرۆین، زووتر یا درەنگتر رووبەرووی ئەو ڕاستییە دەبینەوە کەوا پێدەچێت ڕەهەندی زیاتر هەبێت وەکو لەو تاکە ڕاستەقینەیەی ئێمە تیایدا دەژین و زۆر بەباشی دەیزانین. دەست دەکەین بە پرسیارکردن لە ژیانمان و ئەوەی ڕاستی بوو بۆ ئێمە لەناکاو دەست بە دارمان دەکات! دڵنیانین چیتر ئەگەر بەدڵنیاییەوە لە ڕاستەقینەیەکدا دەژین یان چیتر ڕاستەقینە نییە لە کۆتاییدا.

وزە ڕەهەندییە بەرزترەکان بانگمان دەکەن، دەست دەکەین بە لەرینەوە لەگەڵیاندا و دەرۆین بۆ گەڕانمان بۆ دۆزینەوەی زیاتر دەربارەی ئەوەی ئێمە بەڕاستی کێین. فێردەبین دەربارەی وزە گەردوونییەکان و لەرەلەرە جیاوازەکان، وە ئەوەی کەوا بەرزبوونەوە بەڕاستی چییە، گۆڕانێکی وزەیی لە 3D بۆ 5D بە بەرزکردنەوەی لەرەلەرەکانمان بۆ ئاستێکی زۆر بەرزتر، وە گۆڕینی لەرەلەرە نزمەکانی ترس بۆ خۆشەویستی ڕەها بۆ خاڵێک کە هیچ ترسێک بوونی نەماوە. رووبەڕووی زانیاری زۆر دەبینەوە و زۆر شت دەربارەی خۆمان، گەردوون و مرۆڤایەتی فێردەبین.

پرسیارێک کە بەزۆری سەرقاڵمان دەکات بریتییە لەوەی کە چۆن جیاوازی لەنێوان ڕەهەندەکاندا بکەین؟ بۆ تێگەیشتن لە ڕەهەندە جیاوازەکان ، با یەک لەدوای یەک سەیرێکیان بکەین...

# ڕەهەندی سێیەم

ڕەهەندی سێیەم بریتییە لە جیهانی ماددی ترس، چونکە لە جیهانێکی ماددیدا دەژین و منیش پیاوێکی ماددیم. مادۆنا زۆر بەباشێ وێنای ڕەهەندی سێیەم دەکات لە گۆرانییەکەیدا. باس لەوە دەکات چۆن تەنها لەگەڵ ئەو کوڕانە دەڕواتە دەرەوە کە پارەیان هەیە بۆ کڕینی شتەکانی و چۆن هەست بە لەدەستدانی پارەکەی دەکات هەر کات گەیشتە ناو حاڵەتی هەبوون. ڕەهەندی سێیەم هەمووی دەربارەی ماددەیە، بەدەستهێنانی مادده و ژیان لە ترسی لەدەستدانی دووبارە. دەترسین کۆنترۆڵ لەدەست بدەین. دەترسین پارێزراو نەبین و بەشێوەیەکی پێویست باش نەبین. متمانە بە خەڵک ناکەین چونکە دەتوانن سامانەکەمان لێببەن، بۆیە هەوڵدەدەین دەسەڵات بەدەست بهێنین بەسەر ئەوانی تردا تا لە شوێنێکی بەهێزتر بین.

پێناسەی خۆمان دەکەین لەم ڕووتەختەدا بەوەی کە هەمانە و ئەوەی دەیکەین بۆ ژیان. بڕوامان وایە جیابووینەوە لە خوا و هەموو کەس و هەموو شتێک. هەتاوەکو یەک نەبین لەگەڵ سەرچاوەکە، ناتوانین ئەزموونی یەکییەتی بکەین لەگەڵ هەموو ئەوەی کە هەیە. بڕوامان وایە مردن شتێکی ئازاربەخش، تاریک و کۆتاییە. بڕوامان وایە تەنها یەک ژیان دەژین و تەواو. بڕوامان وایە ئەم جیهانە شوێنێکی ترسناکە، بۆیە پێمان وایە دەبێت بەسەختی بجەنگین بۆ خودی خۆمان چونکە بەشی پێویست نییە بۆ هەموو کەسێک. بڕوامان وایە ژیان پێشبڕکێیەکە لەگەڵ براوەکان و دۆڕاوەکان. پێمان وایە ئاساییە درۆ بکەین چونکە هەموو کەس دەیکات لەم یارییەدا. قبوڵمان کردووە دەبێت ڕاستبین دەربارەی شتەکان.

بڕوامان بە ڕۆڵی دیاریکراو هەیە بۆ پیاو و ئافرەت: پیاو ڕاهێنەرە بەهێز و شەڕکەرەکەیە؛ ئافرەتیش چاودێرە لاوازەکە. ئەمە گۆڕاوە لەگەڵ بەرزبوونەوەی ئافرەت لەماوەی دەییەکانی ڕابردوو، بەڵام سروشتی ڕاستەقینەی نێرینە و مێینە بەتەواوی تێنەگەیشتراوە، دەربارەی پەیوەندییەکان و سێکس. بڕوامان وایە ناتوانین تەواو بین بەبێ کەسێکی تر. بڕوامان وایە پێویستیمان بە کەسێکە تا دڵخۆشمان بکات و تەواومان بکات. لە هەلی زۆر دەگمەندا ئەزموونی شادی دەکەین لە حاڵەتەکانی جوانی هەناسەبڕ، لە سروشتدا بێت یاخود بوونەوەری سێکسی. ئەمە ئەو ساتە دەگمەنانەن کە دەمانخەنە ناو ئێستا، تاکە شوێن کە خۆپەسەندی تیایدا بوونی نییە. هێندە بە خۆپەسەندییەوە ڕاهاتووین کەوا ناپرسین ئاساییە یاخود نە کە هەموو کاتمان بەفیڕۆ دەدەین لە ڕابردوودا یان لە داهاتوودا. ئەو گرەی خۆپەسەندی کە پێویستە؛ دەتوانێت؛ دەبێت یاری

بکات لە ڕابردوودا یان خۆی هەڵبداتە داهاتوو، یاری دروستکردنی سیناریۆکان دەکات تا ئامادەبێت بۆ ئەگەرەکان. نابینین کەوا تاکە شوێن دەبێت لێی بین ئێستایە.

مرۆڤەکانی ڕەهەندی سێیەم زۆر تینووی سێکسی فیزیاییین چونکە تاکە هەلە بۆیان تا ئەزموونی یەکگرتنی وزەکانی نێرینە و مێینە و هاوسەنگی نایاب بکەن، ئەمە هۆکاری ڕەگی ئەم دروشمەیە. لە ڕەهەندی سێیەمدا، تێناگەین کەوا لێرەوە پێویستی هاوبەشێک دروست دەبێت. تێناگەین کەوا دەتوانین ئەم تەواوییە بۆخۆمان دروست بکەین، بەڵام نەوەکو دەتوانین، بەڵکو دەبێت مامۆستایەتی بکەین بۆ چوونە ناو ڕەهەندە بەرزترەکان. ناتوانین بهێنی بەرچاو کەوا حەزە سێکسییەکان دەتوانرێت بگۆڕدرێن لە پێویستی هاوبەشی کردن.

لە ڕەهەندی سێیەمدا، هەرگیز فێرنەبووین خۆمان خۆشبوێت. بە پێچەوانەوە، فێرکراوین بڕوامان بەوە هەبێت کەوا ئەمە خۆپەسەندییە، بەڵام بە پێچەوانەوە، لەم حاڵەتەدا خۆ خۆشنەویستن خۆپەسەندییە، بە بیرکردنەوە لەوەی چی تەواوت دەکات و چ شتێک بەتاڵییەکە بە زیندوویی دەهێڵێتەوە تیاتدا.

وزەییانە، ڕەهەندی سێیەم ڕووتەختێکی لەرینەوەی نزمە و خەیاڵی جیابوونەوە، دووانی و خواستی ئازاد بەهێز دەکات. خودی بەرزترمان نابەسترێ بە جەستەی فیزیاییەوە چونکە ناتوانێت بەرگەی چڕییەتی و لەرینەوە نزمەکەی بگرێت، بەڵکو بە جەستەی ڕۆحییەوە پێمانەوە بەستراوە. بەڵام کاتێک چاکراکان دەگیرێن، زۆر بەزەحمەت دەتوانێت پێمان بگات، ئەمە دەبێتە هۆی ئەو بڕوایەی کەوا ئێمە جیابۆوەین لە خوا.

لە 3D، بەڕاستی پێمان وایە ژیانمان لەسەر ڕێکەوت بنیاتنراوە و هیچ قەدەرێک بوونی نییە، چونکە ئاگادار نین لە ناسنامەی ڕاستەقینەی خۆمان و بوونی ڕۆحمان لە جەستەی فیزیاییدا، کە تووشی بیرچوونەوە بووین. هەر کە بەرجەستەدبین بۆ ڕەهەندی سێیەم، لەبیری دەکەین کەوا بەڕاستی کێین و بە بیری خۆپەسەندییەوە دەبەسترێین کە تەنها بۆ ئەم بەرجەستەبوونەوەیە خزمەت دەکات، ناتوانێت هیچ ژیانێکی پێشووی بیربێت چونکە لەوێ نەبووە لەگەڵماندا. تەنها پێکهاتەی خانییەمان و DNA پێکهاتە هەڵدەگرن لە توخمی خێزانی و گیانمان یاخود خودی بەرزتری خۆمان دەربارەی ئەزموونەکانی ژیانەکانی ڕابردوو دەزانیت.

هەتاوەکو بیری خۆپەسندی لە پێشڕەویدا بێت و دڵمان داخرابێت، بەیەکەوەبەسترانمان بە گیانەوە گیراوە زۆربەی کات. پەیوەندی لەگەڵ خودی بەرزترمان و جیهانە بەرزترەکان تەنها دەتوانرێت هەستی پێبکرێت، تێناگەیشترێت بە بیری ڕێژەیی. بیری خۆپەسەندی ناتوانێت ئەم بڕی

وزەیە لێکبداتەوە، هەتاوەکو بپچڕابین، ناتوانین هەست بە ڕاستییەکە بکەین. بڕوامان وایە بیری خۆپەسەندیمان دەبێت لە پێشڕەویدا بێت چونکە زۆر زیرەک ترە، وە بەڵێ وایە، لە دوورخستنەوەمان لە خودی ڕاستەقینەی خۆمان و هێشتنەوەی خەیاڵەکان. هەرکارێک کە هەستمان دێت ڕاستی دەرببڕێت، بیری خۆپەسەندی هاوار دەکات بیسەلمێنە، بۆتە دووبارە دەکوژێینەوە ناتوانین ئەوە بسەلمێنین کە هەستی پێدەکەین.

بەردەوام دەبین لە کوێرانە ڕۆیشتن، هەوڵدەدەین بزانین ژیان چۆنە و بەڕاستی ئێمە چی دەکەین. بڕوامان وایە وەڵامەکانمان بۆ گەڕانی خۆشی لەڕادە بەدەر دەدۆزینەوە لە دەرەوەی خۆماندا. یاریەکە هەڵدەگرینەوە و خەیاڵەکانی 3D قبوڵ دەکەین وەکو ڕاستەقینەمان، چونکە هەموو خەڵک وادەکات. پرسیارەکان دەربارەی مەبەستمان، ڕەچەڵەکی ڕاستەقینەمان، و بەهرەکان و تواناکانمان دادەمرکێنینەوە، دەبێت هەڵەبین ئەم پرسیارانەمان هەبێت چونکە هەموو کەسێکی تر بەپێی هەمان یاساکان دەژی. ئەگەر بە دەنگی بەرزەوە گومانەکانمان و حەزە ڕاستەقینەکانمان باس بکەین، ڕاستەوخۆ بە شێت و خەیاڵبردوویەکی بنچینەیی دادەنرێین. بۆیە تەنها لەگەڵ سیستمەکە دەڕۆین، بەبێ هەستکردن بەوەی کۆیلە کراوین و بیری خۆپەسەندیمان پرۆگرام کراوە بەهەموو جۆرە باوەڕێکی هەڵە.

نابینین کەوا هەموو سیستمەکە ماتریکسێکی بنیاتنراوە لەسەر ترس. هەتاوەکو خەڵک لە ترس دابێت، دەتوانیت لەژێر کۆنترۆڵدا بیانهێڵیتەوە و پارەیان لێبەدەست بهێنیت. پارەیەکی زۆر، بیمەکان، دەرمانسازی و مۆدێل، تەنها چەند نموونەیەکن لەسەر ئەوەی چۆن پارەی زۆر بەرهەمدەهێنرێت بە ترسەکانمان، و پێویستیمان بەوەیە زیاتر و زیاتر پارە پەیدا بکەین تا بتوانین ترسەکانمان بژمێرین. پێمان وایە دەبێت گەشە بە پلەی خۆمان بدەین، دووبارە و دووبارە، تا وەکو پێویست باش بین و ڕیز بەدەست بهێنین. تەنانەت هەست بەوە ناکەین چەندە جیهانی ماددە، سامانەکانمان کۆنترۆڵمان دەکەن و بە پشتبەستراوی دەمانهێڵنەوە. دەبێت پارێزگاری لەوە بکەین کە پێی گەیشتووین و تەنانەت زیاتریشی بکەین تا ئامادەبین بۆ کارە خراپترەکان.

لە ڕەهەندی سێیەمدا، بیری نەرێنی دەکەینەوە، و متمانە بە هیچ کەس و هیچ شتێک ناکەین. خەیاڵی دووانی لە ڕەهەندی سێیەمدا ڕێگەمان دەدات ئەزموونی ڕووناکی و تاریکی، باش و خراپ، شادی بێ هیوایی، باشتر و خراپتر بکەین. هەڵبژاردەی ئەوەمان هەیە وەکو فریشتە یاخود شەیتان ڕەفتار بکەین، ئەمە لەڕاستیدا تاکە هەڵبژاردەیە لەم ڕووتەختەدا هەمانە، خۆشەویستی یان ترس، ڕووناکی یان تاریکی، ئەمەیە کە خواستی ئازاد ڕێگەمان دەدات. هەتاوەکو ترس هەڵبژێرین، ئەزموونەکانمان و شێوازەکانمان دووبارە دەکەینەوە هەتاوەکە فێردەبین خۆشەویستی هەڵبژێرین،

ئەمەیە جوانی ڕەهەندی سێیەم. هەرکاتێ فێربووین هەمیشە خۆشەویستی هەڵبژێرین، دەگەین بە ڕووناکبوونەوە، چونکە لەرینەوەمان زۆر بەرز دەبێتەوە.

بەم ڕێگایە، بەسەر سنووسرەکانی بیری خۆپەسەندیدا سەردەکەوین، فێردەبین ڕێگە بە دڵ و گیانمان بدەین پێشڕەوی بکەن لە گۆڕینی خۆپەسەندیمان بۆ ڕۆحێکی ئازاد. فێردەبین چۆن وزە گەردوونییەکان کار دەکەن و چۆن دەتوانین ڕاستەقینەمان دروست بکەین. تێدەگەین کەوا سوکانەکەمان لەبەردەم بووە هەموو کات، تەنها نەمان بینیوە. فێردەبین کەوا هیچ قوربانییەک و تاوانبارێک بوونی نییە، تەنها مامۆستا هەیە تا هاوکاری گەشەسەندنمان بدات. پێویست ناکات چاوەڕێ بکەین هەتاوەکو دەمرین تا بگەین بە ڕووناکی، دەتوانین ئەمە بکەین لە جەستەی مرۆڤیدا بکەین.

# ڕەهەندی چوارەم

ڕەهەندی چوارەم بریتییە لە جیهانی سحراوی خەون، بەهەمان شێوە ناودەبریت بە ڕووتەختی ئاستراڵ. ڕەهەندێکە کەوا کەمتر چڕ و زیاتر شلە وەکو لە ڕەهەندی سێیەم، بەڵام هێشتاش خەیاڵی دووانی هەڵدەگرێت و خۆد دەتوانێت لێرەش بوونی هەبێت. ئەمە ڕەهەندی کاتە، بیهێنە بەرچاوت جۆگایەکی وزە بێت هەموو ڕووداوەکانی کاتە هێڵێکی دیاریکراوی لەخۆگرتووە.

بەزۆری بەسروشتی دەچینە ناو ئەم ڕەهەندەوە لە شەودا. لێرە، لە باری خەوتناندا، هەموو شێک دەکرێت. مشکێک دەتوانرێت بگۆڕدرێت بۆ شێرێک، دەتوانین بفڕین یاخود لەژێر ئاو هەناسە بدەین، دەتوانین لەزۆر شوێن بین لەهەمان کاتدا و گفتوگۆ بکەین لەگەڵ نامۆترین بوونەوەرەکان.

گەشتگەرە بەئەزموونەکانی ئاستراڵ دەتوانین بچنە نا ئەم ڕووتەختەوە بەهەمان شێوە لە ڕۆژدا، ئەمە دەتوانرێت هێندە ڕاستەقینە بێت وەکو ئەوەی ئەزموونی سەرکێشییەکی دەرەوە جەستە یاخود ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی سێکسی بکەن. ئەمە ئەو ڕووتەختەیە شامان و شارستانییەتە کۆنەکان گەشتیان بۆی کردووە، ئەم گەشتانە ڕێگەی پێیاندا بچنە ناو جیهانی ژێرەوە و جیهانی سەرەوە. زۆرێکیان دەرمان و ڕێوڕەسی خیاڵبردنەوە بەکاردەهێنن تا بچن بۆ، بەپێی لەرینەوەی وزەی خەڵکەکە. گەشتکردن لە ڕووتەختی ئاستراڵدا دەکرێت ئەزموونێکی زۆر خۆشەویست و چێژبەخش یان زۆر ترسناک و مەترسیدار بێت.

دەرمانە ڕۆحییەکان هەرگیز نامانگەیەنن بە سەروو ڕەهەندی چوارەم، لەگەڵ ئەوەشدا، گەشتکردن بە ڕووتەختی ئاستراڵدا دەکرێت زۆر زانیاریبەخش بێت بۆ فێربوونی زیاتر دەربارەی خۆمان، دەربارەی مەبەستمان، و و هەروەها دەربارەی ترسەکانمان چونکە گفتوگۆ دەکەین لەگەڵ خودی بەرزتری خۆمان لێرە. گرنگ نییە چەند دوور گەشت دەکەین لە ڕەهەندەدا، هەمیشە لەسەر کاتەهێڵی دیاریکراو دەمێنینەوە.

لەم ڕووتەختەدا، بەهەمان شێوە دەکرێت بچیتە ناو ئاگایی بەکۆمەڵ و لێیناەوە فێرببیت. ڕووتەختی ئاستراڵ ئەو شوێنەیە کە ڕووناکی و تاریکی تیایدا دەکەونە ناکۆکی زۆر بەئاسانی. سحری تاریک شوێنی خۆی هەیە لێرە. خەورۆیشتووەکان، بۆ نموونە، دەتوانن کاریگەریان لەسەرمان هەبێت لە ڕووتەختەدا بەئاسانی کاتێک هێشتاش پڕین لە ترس و فێرنەبووین سنوورە تەندروستییە وزەیەییەکان دابنێین، ئەمە ئەو کاتەیە کە دەتوانین ڕووناکی خۆمان دروست بکەین و بیهێڵینەوە تاوەکو زۆر بەئاسانی تاریکییەکە هەڵبمژێت.

زۆرێک لە خەڵک ئەزموونە ئاستراڵییەکانیان بیرناکەوێتەوە بەئاگایی، کە تەنانەت هەستکردن بە دەست تێوەرەدانە وزەییەکان سەختتریش دەکات. ڕەهەندی چوارەم ڕووناکی و تاریکی بەیەکەوە دەبەستێتەوە. لەسەر ئەم ڕووتەختەدا، دەتوانین خۆمان بپارێزین تەنها بە یاسا وزەییە گەردوونییەکان چونکە هیچ یاسایەک و ڕێکخستنێکی مرۆڤی نییە بۆ کۆنترۆڵ.

تێبینی لاوەکی، خەڵکی لەرەلەر بەرزتر هیچ ئاگاییانە هەست بە ڕووتەختی ئاستراڵ ناکەن، بۆیە زۆربەی کات هەست بە تەنهایی دەکەن یاخود پێیان وایە خەیاڵی بەئاگاهاتن و بەرزبوونەوەیان دەکەن، چونکە ئەم هەموو ئەزموونە شێتانەیان نییە کە خەلکی تر هێندە دەڵخۆش دەبێت پێی. لەرەلەری جەستەی ئەم کەسانە خۆی بەرزترە لە لەرەلەری ڕەهەندی چوارەم لە لەدایکبوونەوە.

خەڵکی لەرەلەر بەرزتر ئەزموونی شەکەتییەکی تێنەگەیشتراو دەکەن لەماوەی بوونی ڕەهەندی سێیەمیاندا، جیاوازی نێوان چڕی لەرە ڕەهەندییە سێیەمییەکان و لەرەلەرە زۆر سوکترەکانی ڕەهەندی پێنجەم دەبێتە هۆی جیابوونەوەیەکی هەمیشەیی و جەستە کاتێ سەختی دەبێت بۆ مامەڵەکردن لەگەڵیدا. وەکو هەموو کەسێکی تر بە پرۆگرامکردنی 3D دەڕۆن، هەرچەندە بەزۆری هەستێکی زۆر بەهێزتریان هەیە کە ئەمەی ڕوودەدات ڕاست نییە و زۆربەی کات پرسیار لە سیستمەکە دەکەن و وێرانی دەکەن.

زۆرێک لە خەڵکی لەرەلەر بەرزتر تووشی ژیانی کحول و دەرمان دەبن چونکە ناتوانن لەگەڵ چڕیەتییەکەدا بەباشی برۆن و نکۆڵی دەکەن لە توانا و بەهرە ڕۆحییەکانیان، تەنها دەیانەوێت ئاسایی بن و بگونجێن لە قۆناغێکی زووی ژیانیاندا. کێشەکە ئەوەیە، دەرمان کحول لە لەرەلەری زۆر نزمترن وەکو لە جەستەیان، دەتوانن ببنە خۆی خەمۆکی و پەستی هەمیشەیی.

خەڵکی لەرەلەر برزتر ئەزموونی کابوس ناکەن، دەتوانن هێرشێکی ترس و بیری ئاڵۆزیان هەبێت پێش خەوتن یان کاتێ نیوە ئاگان. بەڵام خەونەکانیان، ئەگەر بیریان بێت بەهەر شێوەیەک، لە 5D و سەرووتردا ڕوودەدەن. ئەم خەونانە ناتوانن ترس و تاریکی لەخۆبگرن چونکە ئەمانە ڕووتەختی خۆشەویستی ناکۆتان.

ئەزموونی بەرزبوونەوەیان بە جیاوازی دەکەن، بەڕێگایەکی زۆر جێگیر، هەستبەخشانە تر. بەئاهاتنیان دەستپێدەکات و ڕۆحیان دەکەنەوە. پرۆسەکە بەزۆری خێراتر ڕوودەدات وەکو لە ناوەند و پرۆگرامکردنی 3D پاکدەکەنەوە زۆر بەخێرایی چونکە سیستمەکەیان دەیەوێت بگەڕێتەوە بۆ لەرەلەری سروشتی خۆی هەرچەند خێرا دەتوانرێت بکرێت.

هەر کە دەستیان پێکرد، بەزۆری بە ئاشکرا ئاگادارن، واتە لەناکاو شت دەزانن بەبێ ئەوەی بزانن بۆچی، ئەمە چونکە پەیوەندیان هەیە لەگەڵ کاتەهێڵ و ڕەهەندی تر، کە بەزۆری نائاگاییانە ڕوودەدات. تەنها چەند خولەکێک لەدەست دەدەن و هەست بە ساردی و سەرلێشێواوی دەکەن دوای ئەزموونێکی لەم شێوەیە. هیچ باشتر و خراپتر بوونێک نییە لە بوون بە لەرەلەری بەرزتر یاخود نا، ئەزموونەکان تەنها جیاوازن.

# ڕەهەندی پێنجەم

ڕووتەختی پێنجەم ڕووتەختی ڕووناکییە، کۆتا دانەی ڕووناکی پوخت و خۆشەویستی ناکۆتایە، ئەمە سەرچاوەی وزەیە لەڕێگای هاتنە خوارەوەی پێش چوونە ناو جیهانەکانی سنووورداری و دووانییەتی. ئەمە ڕەهەندی سەروو کاتی هێڵییە، ئەمە واتە دەتوانرێت پەیوەندی بکرێت بە زۆرێک لە کاتەهێڵی جیاواز.

بوونی فیزیایی هێشتاش دەکرێت لەم ڕووتەختەدا، هەرچەندە جەستە سوکتر و لە پێکهاتەیەکی خانەیی جیاوازە. کاتێ جەستەی فیزیایی بەتەواوی دەگۆڕدرێت بۆ ئەم پێکهاتەیە، هیچ ئازارێک بوونی نییە، زیاتریش، هیچ ترسێک بوونی نییە، ئەمە ڕووتەختی خۆشەویستی ناکۆتا و فرەییە. لە دەرکەوتن لە فیزیاییدا، خودی بەرزترمان بە تەواوی بەستراوە بە جەستەی فیزیاییمانەوە و دەستی بەسەر ڕێبەریکردندا گرتووە، ئەمە زۆر جیاوازترووە وەکو تەنها لە پەیوەندیکردن بە خودی بەرزتر. یەکەمجاک کە خودی بەرزترت دەچێتە ناو جەستەی فیزاییەوە ئێجگار بەهێزە، لێشاوەێکی توندی خۆشەویستی ناکۆتا و هەموو شتێک سوکە و وەستاوە. پێش ئەوەی خودی بەرزتر  بە تەواوی لە جەستەی فیزیاییدا جێگیر ببێت، تەندروستی کردنی هەموو جەستەکان، بیری، سۆزداری و فیزیایی دەبێت ناچار بکرێن، لەمەوە خودی بەرزترت خۆی دەخزێنێتە ناوەوە و دەرەوە بۆ ماوەیەک هەتاوەکو دەتوانێت بۆ هەمیشەیی.

دەزانیت خودی بەرزترت پێوەبەستراوە کاتێ پرسیار لە لێشاوی گەردوونی ناکەیت و تەنها متمانە بە گەشتەکەت دەکەیت، هەست ناکەیت پێوسیتی بە دەستێوەردان یان کۆنترۆڵ کردنی ئەو لێشاوە هەبێت چیتر. لە ڕەهەندی پێنجەمدا، هەموو کردارەکانت لەسەر خۆشەویستی بنیاتنراوەن، ئەمە ڕووتەختی یەکییەتییە، ئەو شوێنەی هەست بە بەیەکەوەبەسترانی هەموو کەس و هەموو شتێک دەکەین لەدەروبەرمان، بە وزەی پیرۆزی سەرچاوەکەشەوە.

لە ڕەهەندی پێنجەمدا، لە ئاگایی یەکگرتوودا دەژین، بەڵام هێشتاش هەست بە تاکییەتی خۆمان دەکەین وەکو بەشیک لە هەمووەکە. لەسەر ئەم ڕووتەختە، بیرماندێتەوە بەڕاستی کێین و بەئاگاین لە گیانی هەتاهەتایی خۆمان. دەرخستن ئاسانە و ژیانی خەونەکەمان ڕاستەقینەکەمانە. لە 5D هەموو شتێک بەبێ هەوڵ دێت چونکە دۆزیومانەتەوە کەوا لێشاوی وزەی گەردوونی هەمیشە بە نایابترین شێوە ڕێبەریمان دەکات. هیچ سنوورێک نییە، لە ئازادی و ڕووی ڕاستەقینەیی تەواودا دەژین، چونکە هیچ ترسێک بوونی نییە، هیچ تەمەن ڕۆیشتن و نەخۆشییەک بوونی نییە،

هەرچەندی ئێمانەوێت دەژین هەتاوەکو بڕیار دەدەین جەستە جێبهێڵین، ئەمە بەنەرمی و بەبێ هیچ ئازارێک ڕوودەدات.

ژین لە 5D واتە ژین لە دڵەوە، لەڕێگای دڵمانەوە دەبەسترێین و دەتوانین هەست بە بەیەکەوەبەستران و خۆشەویستی بکەین ڕاستەوخۆ. لە ڕەهەندی پێنجەمدا، حەزە سێکسییەکانمان دەگۆڕێن چونکە گەیشتوون بە هاوسەنگییەکی ناوەکی لەنێوان وزەکانی نیرینە و مێینە. بوونین بە بلیمەتی ئاندرا وزەییانە، وزەکانی سێکسی دەتوانرێت ئەزموون بکرێت بەبێ پەیوەندی فیزیایی لەگەڵ ئەوانی تردا، دەتوانرێت دروست بکرێن لەلایەن تاکەکەوە. بۆیە سێکس لە پێویستی و تینوویی ڕوونادات چیتر، بەڵکو دەبێت بە هاوبەشییەک لە نێوان دوو خەڵکی تەواودا کە لەسەر هەمان ئاستی وزە دەلەرنەوە، یاخود بە تەنها ئەزموون دەکرێت و بەهەمان شێوەش جوانە. لەگەڵ ئەوەمەشدا، وزەی سێیەم، وزەی خوایی، بەشێکە لەم ئەزموونە و سێکس کردن دەبێت بە ترینتی پیرۆز لە هاوسەنگی نایابدا. بەهیزترین هێزی دروستکراوە، بۆیە سەیر نییە کەوا سێکس لە 3D پێناسە کراوە وەکو شتێکی ئابڕووبەر و تاوان تا خەڵکی بهێڵێتەوە لە دۆزینەوەی هێزی دروستکەری ڕاستەقینەی خۆیان.

هەرکاتێ کەسێک لەرەلەری خۆی بەرزکردەوە بۆ ئاستی 5D، چیتر گەڕانەوە بۆ ڕەهەندە نزمترەکان ناکرێت مەگەر گیانەکە ئاگاییانە هەڵیبژێرێت، ئەمە ئەو هەڵبژاردەیە بووە زۆرێک لە ستار سیدەکان و بوونەوەرە فریشتەییەکان هەڵیانبژارد بۆ یارمەتیدانی مرۆڤایەتی لە بەرزبوونەوە. خەڵک لە 5D لاوازن بۆ لەرەلەری نزم چونکە هیچ لەرینەوەیەک نییە بۆیان تیایدا، هیچ تاریکییەک کێش ناکەن و بەتایبەتی لە ڕووناکیدا دەژین. ناتوانرێت ببینرێن لەلایەن خەڵکی 3D ئەگەر پرۆسەی بەرزبوونەوەیان دەستی پێنەکردبێت و نەکرابێتەوە بۆ لەرەلەرە بەرزترەکان، ئەمە کاتێک ڕوودەدات کە کاتی هێڵی و دووانییەتی جیادەبنەوە و هەموو ئەوەی دەمێنێتەوە ژیانە لە ئێستادا، هەموو ئەزموونەکان ڕێزیان لێدەگیرێت بە سوپاسەوە چونکە گیانەکە دەزانێت کەوا هەموو شتێک مەبەستی خۆی هەیە بۆ گەشەکردنی خۆی و فراوانکردنی ئاگایی. پەیوەندی لەگەڵ بوونەوەری دەرەکی و بوونەوەرە فریشتەییەکان ئاسان دەبێت و دەبەسترێتەوە بە ئەزموونی ژیانی ڕۆژانە. ڕاستەوخۆ زانیاری لە ڕۆحەوە وەردەگرین و تەلەپاتی، تەلەپۆرتەیشن، تەلەکەنیسس دەتوانرێت بکرێن.

ڕیهەندی پێنجەم ڕەهەندی متانەی قوڵە و ناوەکییانە فێربووین کەوا هەموو شتێک لەگەڵ لێشاوەکەدا دەڕوات و ڕیگە بە سەرچاوەکە دەدەین کارمان پێبکات بۆ دروستکردنی موعجیزە. هیچ پێویست ناکات ڕاست بیت لە 5D چونکە هیچ خۆپەسەندییەک بوونی نییە، خۆپەسەندیمان

بەرزبۆتەوە بۆ ڕۆح ئازاد و دەستاو دەست لەگەڵ جەستە و گیان کار دەکات. لە ڕەهەندی پێنجەمدا، هیچ شتێک تایبەتییانە وەرناگرین چیتر لەو خەڵکانەی نەگەیشتوون بەم ڕووتەختە هێشتا، دەربارەی بار و گەشتی خۆیان دەزانین و بڕیاریان لەسەر نادەین یاخود سەرزەنشتیان بکەین، بەڵکو خۆشماندەوێن ناکۆتاییانە چونکە دەزانین بەشێکن لە هەمووەکە.

دەزانین کەوا هیچ مەترسییەک نییە، بۆیە دەزانین کەوا هیچ پێویست بە پاراستن ناکات. دەزانین کەوا ڕووناکییەکەمان هێندە دەدرەوشێتەوە، کەوا ئۆتۆماتیکیانە تاریکییەکە هەڵدەمژێت. لە 5D، بە پێی یاسا گەردوونییە وزەییەکان دەژین، دەزانین کەوا بیر لەچی بکەینەوە دروستی دەکەین. هیچ یاسایەکی دروستکراو بوونی نییە، چونکە خەڵک بەتەواوی متمانەیان بە لێشاوی وزەیی و ئەو شوێنەی دەیانبات و ڕێبەریان دەکات هەیە.

هیچ پێویست بە سامان و پلە ناکات، چونکە هیچ پێشبڕکێیەک نییە و هیچ شتێک بەراورد بکەیت پێی. هەموو شتێک دەبێت بە هاوبەشی کردن، تەنها هەین، خۆمان خۆشدەوێت و سوپاسگوزارین بۆ تاکییەتیمان وەکو بەشێک لە هەمووەکە. دەزانین کەوا پێویستییەکانمان هەمیشە دابینکراون و هەمیشە پارێزراوین، سوپاسگوزاری هەمیشە بوونی هەیە. کاتێ بۆ هەمیشەیی لە 5D دەژین، گەیشتوون بە بارێکی ڕووناکبوونەوە، لەخۆەوە نییە بە بەهەشتی سەر زەمین ئاماژەی پیدەکرێت.